# بـــــــژارده

## گوڵبژێرێکە لە فەرمودەکانی

## صحيح الجامع الصغير وزيادته

بە گوێرەی بابەتە فیقهی‌یەکان ڕێکخراون

}بەشی یەکەم{

باوکی عبد الله

هەڵی بژاردوون و کردوونی بە کوردی

# بـــــــــــژارده

## گوڵبژێرێکە لە فەرمودەکانی

# (صحيح الجامع الصغير وزيادته)

# الفتح الكبير

شێخی سیوطی    شێخی نەبهانی    شێخی ئەلبانی

شێخی عونی‌شریف

بەگوێرەی بابەتە فقیهی‌یەکان ڕێکی‌خستون

**شێخ علی حسن علی عبدالحمید**

**شەرحی ووشە نامۆ (غریب)ە کانی کردون**

**بەشی یەکەم**

**هەڵبژاردن و وەرگێڕانی**

**باوکی عبدالله**



## پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذوا بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له واشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

أمابعد فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدى هدى محمد (صلى الله عليه وسلم) وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .

خوێنەرانی ئازیزم: بەرلەوەی بچینە خزمەت فەرموودەکان، حەزدەکەم ئەوەی لەنێو دڵمایە سەربارەت بەو دیاریە بچوکەی بەردەستتان کەلە چەند بەشێکدا کۆکراوەتەوە بە بەڕێزتانی ڕابگەیەنم و ڕوونی بکەمەوە:

لەسەرەتای ساڵی (١٤١٥)ی کۆچی گەلێک لەو خوشک و برا بەڕێزانەی کە خەریکی دەرس وتنەوە بوون زۆر جار داوایان لێ دەکردم کە کۆمەڵێک فەرموودەیان بۆ بکەم بە کوردی بەئومێدی ئەوەی کەیەک لەدوای یەکی قۆناغەکان بەقوتابی یە ئازیزو سەرەتایی یەکانی بڵێن، لەگەڵ ئەوەشدا پێشنیاریان ئەوەبو کەفەرموودەکان زۆر درێژ نەبن بتوانرێ بەئاسانی لەبەر بکرێن. پێش ئەوەش لەساڵی (١٤١٤)ی کۆچی برایەکی بەڕێز، چەند نامیلکەیەکی فۆتۆکۆپی کراوی بۆ ناردبوم تا ڕاویەکانی بۆدیاری بکەم لەگەڵ پلەو جۆری فەرموودەکانیش، سەرجەم فەرمودەکانی ئەو نامیلکانە لە کتێبێکی بە نرخی شێخ( محمد ناصرالدين الألباني ) دەرهاتبون، لە

مەرحەمەتی خوا بەزیاد بێ برای بچوکی خزمەتکاریشتان ئەو کتێبەی لەبەر دەست دا بوو، ئەوەی کە شیانی باسە فەرمودەکان لە دو توێی ئەو نامیلکەیەدا بە گوێرەی ساڵەکانیتەمەن ڕیز کرابون لە تەمەنی دوو ساڵی یەوە تا دوانزە ساڵی، زۆر چاکم لە یاد نەماوە دوا بە دوای داوای ئەو بەڕێزانە و داکۆکی کردنیان لەسەر ئەو پڕۆژە بچوکە، قۆڵم لێ هەڵماڵی و بە پشتیوانی خوای پەروەردگار کەوتمە هەڵبژاردنی کۆمەڵێک فەرموودە و کردنە کوردیان، لەو کاتەدا برایەکی بەڕیز خوا پاداشتی بداتەوە یارمەتی چاکی دام هەم لە نوسینەوەی فەرموودەکان ، هەم لە ڕێکخستنی ماناکەیان دا لە سەرەتاد... شێوەی یەک لە دوا یەکی پیتە سەرەتایی یەکان و بە گوێرەی ک... دەستمان کرد بە کردنە کوردیان، قەدەری خوا وابو لەڕێ...
ئازیزی ترەوە نوسخەیەکی تری(صحيح جامع الصغير و زيادتـ...)م دەستکەوت، کە بە پێی بابەتە فقهی یەکان ڕێکخرابون لەلا... ماموستای بەڕێز شێخ(عونی شریف) ەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا شێخ(علی حسن) شەرحی ووشە نامۆیەکانی کرد بوو، بەوە زیاتر دڵم بە کارەکە خۆشبو، پێشتریش ناوی ئەم کتێبەم بەر گوێ کەوتبوو، زۆر بەتاسەوە بوم بۆی، تا بتوانم لەسەر هەمان شێوە ڕێکیان بخەمەوە و لەو ڕووەشەوە بایەخی پێ بدەم و هەوڵ و خزمەتەکەی ئەوانیشتان کەم تا کورتێک بخەمە بەر چاو و وێڕای هەوڵ و خزمەتی(شیخ الألبانی) کە پێش ئەوان هەستا بوو بە جیا کردنەوەی فەرمودەکان لە یەکتری و دیاری کردنی جۆر و پلەیان.
هۆی دواکەوتنی ئەم پرۆژەیەش ئەوەبو کە دەست نوسەکەی خۆم سەری تێدا چوو بوو، وە تا ئێستاش بێ سەر و شوێنە،ماوەیەک لەمەوبەر شەوێک لە ماڵی برایەک لە کتێبێک دەگەڕام، چاوم لە

دەفتەرێك هەڵەنگوت بە خەتێكی زۆر جوان نوسرابو(هەندێك لە فەرمودەكانی صحيح الجامع الصغير ) ی شێخ( محمد ناصر الدين الألباني ) لە خوار ئەویشەوە نوسرا بوو: وەرگێرانی( باوكی عبد الله )، وا دیار بو ئەو برا بەرێزەی كە نوسیبویەوە ساڵێك دوای كردنە كوردی و وەرگێرانی بە دەستی گەیشتووە و نوسیویەتیەوە بە گوێرەی ئەو بەروارەی كە لە دەفتەرەكەیدا نوسیویەتی دوای پێداچونەوەی بریارم دا كە ئەو پرۆژەیە بخەمە گەڕ، لەگەڵ ڕەچاو كردنی سەرجەم ئەوخزمەتانەی كەئەو زانا دڵسۆزانە لەدووتوێی ئەو كتێبەدا پێشكەشی موسڵمانانیان كردوە، بەرێكخستنیان بەگوێرەی بابەتە فقیهی‌یەكان و دیاری كردنی جۆری‌پلەو راویەكانیان و لێكدانەوەی هەندێك لەووشەكان بەجیا، چونكە ئەو نوسخەیەی كەبەپێ‌ی بابەتە فقیهی‌یەكان رێكخراوەو شەرحی هەندێك لەووشەكانی كراوان و لێكدراونەوە، جۆری پلەی فەرموودەكانی‌و راویەكانی لەسەر نەنوسراوە ودیاری نەكراون هاوكات لەگەڵ ئەوانەی كە ئاماژەم بۆ كرد.

كۆمەڵێ فەرموودەی تری لێ زیاد بكەم. چاوێكیش بەوانەی رابردودا بخشێنمەوە و سەرلەنوێ پێیاندا بچمەوە. بەئومێدی ئەوەی گەر خوای پەروەدگار قەڵەمی لێ دابێ بەخوێنەرانی ئازیزی شادبكەم و بیخەمە بەردیدەیان، گشتلایەك لێ‌ی بەهرەمەندبن.

لەكۆتایدا خوازیارم كە خوای گەورە بۆم بیكابە توێشویەك لەڕۆژی دوایداو ئێوەی ئازیزیش لە دوعای بەخێرتان بێ بەشم نەكەن.

براتان

باوكی عبدالله

پێنچی رەجەبی

ساڵی هەزارو چوارسەدو چواردەی كۆچی

# چەند ڕێنموونیو ڕونكردنەوەیەك

***یەكەم:*** ئازیزەكانم هەرچەندە تاوێك پێش ئێستا كەم تاكورتێك ئاماژەمان بو( صحيح الجامع ) كرد، بەڵام پێم خۆشە بزانن ئەو كتێبە لەبنەڕەتدا هی كێیەو كێ دایناوەو چی لێكراوە ئەو كتێبە ( الجامع الصغير من حديث البشير النذير ) لەبنەڕتدا حافظی ( سیوطی ) داینـاوە و، یەكێكە لەو كتێبانەی كەزۆرێك لەفەرموودەكانی پێغەمبەری ئازیزی گرتۆتە خۆ، وێرای ئەوەی بەشـێوەكی زۆر ئاسـان و سـادە هێنراون و ڕێكخراون گەلێك بەسودەو هیچ كام لەمۆسـتاو قوتـابی لێی بێئاتـاج نابن و یەكێكە لە كتێبـە هـەرە ئاسـراوبڵاوەكان لـەناو زۆر بـەی چینـە زانست خوازەكاندا، دواتر هـەر شێخی(سیوطی)خۆی پاشكۆیەكی بۆ داناوەو ناوی نـاوە ( الزيادة على جامع الصغير ) هاوكات لەگەڵ ئـەوەدا بواری ئەوەی بۆ ڕەخساوە كەگشـت فـەرموودەكان لەشـوێنی شـیاوی خۆیان دابنێ، لەدوای شێخی(سیوطی) شێخ یوسفی نەبهانی زیادەكەی خستوتە ناو ( جـامع الصغـير )ەكـەو بەشـێوەیەكی گونجاو و لـەبار تێكەڵی كردوون و ناوی لێنا( فتح الكبير في ضـم الزيـادة إلى جـامع الصغير )، لەپاش ئەویشـدا ( العلامة المناوي ) هەسـتاوە بەشـەرح كـردن و[1] جیاكردنەوەی فەرموودەكان لەیـەكتری تائەندازەیـەكی بـاش لـەو

---

*1) ئاواتە خوازیوم ئەو شـەرحەم بەرچاویكەوتایە لەوكاتـەدا تـابم توانیبایە لـەخێری ئەویش بێ بەشتان نەكەم.*

سەردەمەی خۆشماندا فەرموودەناسی پایەبەرز شێخ (محمد ناصر الدین الألباني) هەستاوەبەجیاکردنەوەی فەرموودەکان لەیەکتری لەگەڵ دیاری کردنی جۆرو پلەیان و کردویەتی بەدووبەش.

بەشی یەکەم: (ضعیف الجامع الصغیر) بەشی دووەم: (صحیح الجامع الصغیر).

فەرموودەکانی بەشی یەکەم (ضعیف الجامع الصغیر) ژمارەیان (٦٤٧٩) فەرموودەیەو (١٠٧٥) فەرمودە هی زیادەکەن فەرموودەکانی بەشی دومیش (صحیح الجامع الصغیر) ژمارەیان (٨٢٣١) فەرموودەیەوە(٣٢٧٣) فەرموودە هی زیادەکەن بەوەش تێکڕای ئەو فەرموودانەی لەم کتێبەدا کۆکرانەتەوە (١٤٧٠٠) فەرمودەن.

دوابەدوای ئەو کارەی شێخ ئەلبانی یەکێك لەقوتابیەکانی هەستاوە بەڕێکخستنی فەرمووودەکانی (صحیح الجامع) بەگوێرەی بابەتە فقتهی یەکان و یەکێکی تریش لەقوتابیەکانی هەستاوە بەلێکدانەوەو شیکردنەوەو شەرح

کردنی هەندێك لەو وشانەی تارادەیەك نامۆن وپێویستیان بەلێکدانەوە هەیەبەندەش هەستاوە بەهەڵبژادن و کردنە کوردیان بەئومێدی ئەوەی لەپەنای ئەو زانا بەڕێزانەدا خزمەتێك بەئێوەی ئازیزم بکەم.

***دووەم:*** ئەو ژمارانەی کەبۆ سەرباسەکان یاخود بـۆ فـەرموودەکان دانراون بەگوێرەی باس و فـەرموودەکانی(هـەڵبژاردە ) خۆیـەتی نـەک هی ( صحيح الجامع الصغير وزيادته ).

***سێیەم:*** لەبەرئەوەی فەرموودەکان بکرێنـە کوردی وبنوسرێتەوە مانای هەندێک لەووشە کانیان لێک دراونەتەوە ،وەکو پێشـتر ئامـاژەم بۆکردشـێخ ( علـی حسـن ) لێکی داونـەوەو شـیکردونەتەوەو لـەوەوە وەرگێڕاون و هەرچی یەکیش خۆم تیشکم خستبێتەسەرو ڕونکردنـەوەم دەربارە نوسیبێ لەکۆتاییەکەیدا پیتی ( و )م داناوەو نوسـیوەە واتـە سابیر واتە ( وەرگێڕ ).

***چوارەم:*** لـەژێر هـەرکام لـەو فەرموودانـەی کەلـەو چـەند بەسـەی ( بژاردە )دا هاتون، چەند هێمایەک دانراون و بەکارهێنراون لەبەر ناوی کتێبەکان و خاوەنـەکانیان بەمەبەسـتی ئـەوەی کـەزۆر شـوێن نـەگرن بۆزانینیان دەتوانن بگەڕێنەوە سەرئەم خشتەیەی دوایی:

| هێماكان | ناوی كتێبه‌كان وخاوه‌نه‌كانیان |
| --- | --- |
| ١-( خ ) | صحیحی ئیمامی بوخاری |
| ٢-( م ) | صحیحی ئیمامی مسلم |
| ٣-( ق ) | هی بوخاری ومسلم |
| ٤-( د ) | سونه‌نی ئه‌بی داود |
| ٥-( ت ) | سونه‌نی ترمذی |
| ٦-( ن ) | سونه‌نی نه‌سائی |
| ٧-( هـ ) | سونه‌نی ئیبنوماجه |
| ٨-( ٤ ) | هی چوار سونه‌نه‌كه‌ی سه‌ره‌وه . |
| ٩-( ٣ ) | هی ئه‌وان ته‌نها ئیبنوماجه نه‌بێ |
| ١٠-( حم ) | موسنه‌دی ئه‌حمد كوڕی حه‌نبه‌ل |
| ١١-( عم ) | عبدالله كوڕی ئه‌حمه‌د له‌موسنه‌ددا |
| ١٢-( ك ) | موسته‌دره‌كی حاكم |
| ١٣-( خد ) | ( الأدب المفرد ) هی ئیمامی بوخاری |
| ١٤-( تخ ) | ( التأریخ ) هی ئیمامی بوخاری |
| ١٥-( حب ) | صحیحی ئیبنو حیبان |
| ١٦-( طب ) | طبرانی له ( الكبیر) دا |
| ١٧-( طس ) | طبرانی له (الأوسط)دا |
| ١٨-( طص ) | طبرانی له (الصغیر)دا |
| ١٩-( ص ) | سونه‌نی سه‌عیدی كوڕی مه نصور |
| ٢٠-( ش ) | موصه ننه‌فی ئیبنوئه‌بی شه‌یبه |
| ٢١-( عب ) | موصه ننه‌فی عبدالرزاق |
| ٢٢-( ع ) | موسنه‌دی ئه‌بی یه‌علا |
| ٢٣-( قط ) | دار القطنی |
| ٢٤-( فر ) | ( مسند الفردوس ) هی ده‌یله‌می |
| ٢٥-( حل ) | ( حلیة الأولیاء ) هی ئه‌بی نوعه‌یم |
| ٢٦-( هب ) | ( شعب الایمان ) هی به‌یهه‌قی |
| ٢٧-( هق ) | سونه‌نی به‌یهه‌قی |
| ٢٨-( عد ) | ( الكامل ) هی ئیبنو عوده‌ی |
| ٢٩-( عق ) | ( الضعفاء ) هی عوقه‌یلی |
| ٣٠-( خط ) | هی خطیبی به‌غدادی |

## ١- دەربارەی شێوازو جۆرەکانی وەحی

(١) احياناً يأتيني (يعني الوَحْي) في مثلِ صَلْصَلةِ الجَرَسِ وهــو أشدُّهُ عَليَّ فيفصَمُ عَنيّ وَقدْ وعيتُ ماقالَ، واحياناً يتَمَثَّلُ لي الملَــكُ رَجُلاً فيكلنِّمُني فاعي ما يقولُ.

(صحيح) (مالك، حم، ق، ي، ن) عن عائشة

زاد (طب) في اخره (وهو اهونه علي) مختصرمسلم ١٥٧٢.

### لێکدانەوەی هەندێک لەووشەکان

١- صلصلة: بریتی‌یە لەدەنگی ئاسن کاتێک کەزۆر دەجوڵێنرێ

٢- فيفصم : دەبچرێنرێ

٣- وعيت : تێگەیشتوم، ووشیاربوم

٤- يتمثل : خۆی دەنوێنێ لەسەر شێوەی.

### مانای فەرموودەکە

(١) هەندێک جار بۆم دێنی (وەحی) لە شێوەی دەنگی زەنگدا،ئەوەیان سەخت ترین جۆریانە لەسەرم، کاتێک دەپچرێنرێو کۆتایی‌دێ بەدڵنیایی‌یەوە تێگەیشتم چی‌ووتوە، وەهەندێک جاریش فریشتە (مەبەستی جبریلە) لەسەر شێوەی پیاوێک دێت و-دەمدوێنێ- قسەم لەگەڵدا دەکا- تێ‌دەگەم کەچی دەڵێ.

(صحیحة) (مالك، حم، ق، ت، ن) لەعائیشەوە گێراویانەتەوە.

( طــــب ) لەکۆتایەکەیدا زیادەیەکی هێناوە کەفەرمویەتی( ئەوە سوک وئاسان ترین جۆریانە کەدێتە سەرم ).

( ٢ ) كان إذا انزِلَ عليهِ الوَحيُ كَرُبَ لذلك وَ تَربَّدَ وَجهُهُ.

(صحيح) (حم، م) عن عبادة بن صامت.

## لیکدانەوەی هەندێک لەووشەکان

١- کرب: توشی خەم و پەژارە دەبوو.

٢- تربد : زۆر سور هەڵدەگەڕا - سور دادەگەڕا-.

## مانای فەرموودەکە

( ٢ ) کاتێک کەوەحی دادەبەزیە سەری_لەئاسمانەوە بۆی دەهاتە خوارێ_ غەمبار دەبوو پێ‌ی و ( ڕەنگی ) ڕووی سور هەڵدەگەڕا.

(صحیحە) (حم، م) لەعوبادەی کوڕی صامتەوە گێڕاویانەتەوە.

( ٣ ) كانَ إذا انزلَ علَيه الوَحْيُ نكَّسَ رأسهُ، ونكَّسَ أصحابُـهُ رؤوسَهُمْ، فإذا اقلَع عنهُ رَفَعَ رأسهُ.

(صحيح) (م) عن عبادة بن صامت.

## لیکدانەوەی هەندێک لەووشەکان

١- نكس: دای دەنەواند-بەوێنەی کەسێک کەبیربکاتەوە،یاخود داڵغەلێ بدا.

٢- أقلع : دەپچڕێنرا.

## ماناى فه رمووده كه

(٣) كاتێك كەوەحی دادەبەزیەسەری لەئاسمانـەوە بـۆی دەهاتـە خـوارێ سـەری دادەنـەواند وهاوەڵەكانیشـی سـەریان دادەنـەواند، وەئەگەر دەپچڕێنرا لیٚ‌ی(كۆتایی پیٚ دەهات) سەری بەرز دەكردەوە. (صحیحە) (م) لەعوبادەی كوڕی صامتەوە ریوایەتیان كردووە.

(٤) رأيتُ جِبْرِيلَ لهُ ستمائةِ جَناح.

(صحيح) (طـب) عن إبن [illegible]

## ليكدانه وه ى هه نديٚك له ووشه كان

١- جـبريل: ئـەو فریشـتەیەیە كـەوەحی بـۆ پێغەمبـەر دەهێنـا بەپیٚ‌ی ئەو فەرموودە فریشتەكان لاشەیان هەیـەو، چـەندین ئایـەتیش بەڵگەن لەسەر ئەو راستی‌یە (و).

٢- جناح: باڵ (و)

## ماناى فه رمووده كه

جبریلم بینی لەسەر شێوەی خۆی شەش سەد باڵی هەبوو.

(صحیحە) (طـب) لە ئیبنو مەسعودەوە ریوایەتی كردووە.

## ٢- دەربارەی گەورەیی باوەڕو نیشانەکانی .

(٥) أبْشِروا، وبَشّروا مَنْ وراءكم، أنهُ مَنْ شَهِدَ أن لاإله إلاالله صادقاً بِها دخلَ الجنةَ.

(صحيح)                    (حم، طب) عن أبي موسى

### لێکدانەوەی هەندێک لە ووشەکان

١- أبشروا: مژدەبێ لێتان (و)

٢- صادقا: بەراست گوێیەوە، بەمانای ئەوەی کەدەری دەبڕێ بەزمان لەگەڵ نیازی دەرونی و بەدرۆ ئەوشایەتی‌یە نەدات (و).

### مانای فەرمودەکە

(٥) مژدە بێ لێتان، و مژدە بدەن بەوانەی دوای خۆتان کەهەر کەسێک شایەتی بدا لەسەر ئەوەی بەوەی کەهیچ پەرستراوێکی شایان بەپەرستن نیە جگە لە(الله) بەڕاست گوێیەوە پێ‌ی- بەوشایەتی‌یە- دەچێتە بەهەشتەوە

(صحیحە)        (حم، طب) لەئەبی موساوە ریوایەتی‌یان کردووە.

(٦) أحَبُّ الأعمالِ إلى الله إيمانٌ بالله، ثمَّ صلةُ الرَّحِمِ ثمَّ الأمرُ بالمعروفِ و النّهي عنِ المنكرِ، وأبغضُ الأعمال إلى اللهِ الاشراكُ بهِ ثم قطعيةُ الرحمِ.

(حسن)                    (ع) عن رجل من خثعم.

## لیکدانەوەی هەندێک لە ووشەکان

١- إيمان: باوەڕ، لەزاراوەیشەرعیدا بەوە پێناسە کراوە (دەربڕینە بەزمان، جێگیر بوونە لەدڵدا، رەنگدانەوەیە لەئەندامەکاندا)( و ).

٢- الأمر بالمعروف: فەرمان کردن بەچاکە (معروف) لەشەرعدا بەتەواوی ئەوکارانە دەوترێ کەبەچاکە باسکراون خۆشویستراون وپەسەندن(و )

٣- النهي عن المنكر: بەرهەڵستی کردن لەخراپە(منکر) لەشەرعدا بەتەواوی ئەوکارانە دەوترێ کە بێزراون ویە خراپە لەقەڵەم دراون وناپەسەندن.

## مانای فەرمودەکە

( ٦ ) خۆشەویست ترینی کردەوە بەلای خواوە باوەڕبونەبەخوا، پاشان جێبەجێکردن و گەیاندنی سۆزی خزمایەتیوپاشان فەرمان کردنەبە چاکەو بەرهەڵستی کردنە لەخراپە و ڕق لێبۆوەترینی کردەوەن بەلای خواوە هاوەڵ دانانە بۆ خوا، پاشان بچڕاندنی سۆزی خزمایەتییە

( حەسەنە )　　　( ع ) لەپیاوێک لە ( خثعم ) ڕیوایەتی کردوە

**( ٧ ) أَفْضَلُ العَمَلِ إيمانٌ باللهِ، وجهادٌ في سبيلِ اللهِ.**

(صحيح)　　　(هـ) عن ابن مسعود.

## لیکدانەوەی هەندێک لە ووشەکان

١- أفضل: چاکترین (و).

٢- جهـــاد: بەخشینی ووزە و توانـا، ئـەم ووشـــەیە ووشـەیەکی قورئانیيە (و).

## مانای فەرموودەکە

(٧) چاکـترین کـردەوە باوەڕبونـە بـەخوا، وبەخشـینی ووزەو توانایە (جیهادە) لەڕێی خوادا.

(٨) مَنْ ماتَ وهوَ يعلَمُ أن لاإله إلا الله دَخَلَ الجنةَّ .

(صحيح) (حم،م) عن عثمان

## لیکدانەوەی هەندێک لەووشەکان

١- یعلم: دەیزانی بێ گومـان زانیـاری (العلم) بـون بەشـەیاتمان و پێویستیيەکانی، یەکێکە لەمەرجەکانی (لااله إلا الله) (و)

٢- إله:(پەرستراو)پەرستراویش بەوە دەوترێ، کەبەگەورە گیراوەو لەدڵدا خۆشویستراوە وگوێ ڕایەڵکراوە (و)

## مانای فەرموودەکە

(٨) هـەر کەسـێک مـردو- ئـەو کەسـە- دەیزانـی کـە هیـــچ پەرســتراوێک شـایانی پەرسـتن نیـە جگـە لـە (خــوا) دەچێتــە بەهەشتەوە.

(صحیحە) (حم، م) لە (عثمان)ەوە ڕوایەتیان کردووە.

(٩) مَن ماتَ لايشركُ باللهِ شَيئاً دخلَ الجنة.

(صحيح) (حم، ق) عن ابن مسعود

**مانای فه رمووده که**

(٩) هەرکەسێک مردو هیچ شتێکی نەکردبوە هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا چوەتە بەهەشتەوە.

(حم، ق) لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتیان کردوە

(١٠) أشهد أن لاإله إلاالله وأني رسولُ اللهِ لايلقى الله بهما عبدٌ غير شاكٍّ فيهما إلا دخلَ الجنة.

(صحيح) (حم، م) عن أبي هريرة

**مانای فه رمووده که**

(١٠) شایەتی دەدەم کەهیچ پەرستراوێک شایانی پەرستن نیە جگە لەخوا، وەمن پێغەمبەری خوام (ئەودوانە) هیچ بەندەیەک نەگەیوە بەخوا پێیان وگومانی نەبوە تێیاندا ئیلا(مەگەر) چۆتە بەهەشتەوە.

(صحیحة) (حم، م) لەئەبی هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە.

( ١١ ) يا معاذُ بن جَبلٍ: هل تَدْرى ماحقُّ الله على عِبادهِ وماحقُّ العبادِ على الله؟ فإن حق الله على العبادِ أن يعبدوهُ ولايُشركوا بــه شَيئاً، وحق العباد على الله أن لايُعذِّبْ مَنْ لايشرك بهِ شيئاً.

(صحيح) (حم، ق، ت، هـ) عن معاذ بن جبل.

## ليكدانه وه‌ى هه‌نديك له‌ووشه‌كان

١- العباد: به‌نده‌كان، كۆى ( عبد )

٢- يعبدوه: بيپه‌رستن، په‌رستنيش: بريتى‌يه له‌ته‌واوى ئه‌و كرده‌وانه‌ى كه‌خوا پى‌ى خۆشه و جى‌ى ره‌زامه‌ندى‌يه‌تى، له‌ووته‌و كرده‌وه‌ى ده‌رو ده‌روون، و دووركه‌وتنه‌وه له‌ته‌واوى ئه‌وشتانه‌ى كه‌مايه‌ى تووره‌يى خواى گه‌وره‌ن( و ).

## ماناى فه‌رمووده‌كه

( ١١ ) هۆ موعازى كورِى جه‌به‌ل: ئايا ده‌زانى مافى خوا چى‌يه به‌سه‌ر به‌نده‌كانى‌يه‌وه، وه‌مافى به‌نده‌كانى چى‌يه به‌سه‌ر خواوه، مافى خوا به‌سه‌ر به‌نده‌كانى‌يه‌وه- ئه‌وه‌يه- كه بيپه‌رستن و هيچ شتيك نه‌كه‌نه هاوه‌ڵ و هاويه‌شى وه‌مافى به‌نده‌كانيش به‌سه‌ر خواوه ئه‌وه‌يه كه‌سزاى ئه‌وكه‌سانه نه‌دا، كه‌هيچ شتيك ناكه‌نه هاوه‌ڵ بۆى خوا.

( صحيحة ) ( حم، ق، ت، هـ ) له‌موعازى‌كورِى جه‌به‌له‌وه ريوايه‌تيان كردووه.

(١٢) كلُّ ذنبٍ عسى الله أن يغفِرَهُ، إلاَّ مَنْ ماتَ مُشـــركاً أو قَتَلَ مؤمناً متعمِّدا.

(صحيح) (د) عن أبي الدرداء (حم، ن، ك) عن معاوية

**ماناى فەرموودەكە**

(١٢) نزيكە خواى گەورە لەهەموو تاوانێك (لەتاوانى هەموو كەسێك) خۆش ببێت مەگەر كەسێك مردو هاوەڵى بۆخوا دانابوو، يان بەئەنقەست بړوادارێكى كوشتبوە.

(صەحيحە) (د) لەئەبى دەردائەوە ڕیوایەتی كردوە (حم، ن، ك) لەموعاويەوە ڕیوایەتیان كردووە.

(١٣) الإيمانُ أنْ تؤْمِنَ باللهِ وملائكتهِ وكتُبهِ ورُسُـــلهِ واليَومِ الاخر وتؤمِنَ بالقدرِ خيرهِ وشرِّهِ.

(صحيح) (م، ٣) عن إبن عمر

**ماناى فەرموودەكە**

(١٣) باوەڕ هێنان ئەوەيە باوەڕ بێنى بەخواو فريشتەكانى و كتێبەكانى و پێغەمبەرانى و هاتنى ڕۆژى دوايى وەباوەڕ بهێنى بەقەدەر بەچاك و خراپى يەوە-سوود و زيانىيەوە-

(صەحيحە) (م، ٣) لەئيبنو عومەرەوە ڕیوایەتیان كردووە

(١٤) أفضَلُ الايمانِ الصَّبرُ والسَّماحةُ.

(صحيح) (فر) عن معقل بن يسار، (تخ) عن عمير الليثي.

## ماناى فه رمووده كه

(١٤) باشترینی باوەڕ هێنان ، ئارام و لێ بووردیی یه

(صەحیحە) (فر) له معقل کوڕی یەسار

(تخ)، لەعومەیری لەیثی‌یەوە ڕیوایەتیان کردووە.

(١٥) الإيمانُ بِضْعٌ وستّون شعبةً ، والحَياءُ شُعبةٌ مِنَ الإيمان.

(صحيح) (خ) عن أبي هريرة.

## لیكدانه وه ى هه ندێك له ووشه كان

١- بضع: ئەوەندە، له سێوە تا نۆ(بضع) ى پێ دەوترێ(و)

٢- الحياء: شەرم

## ماناى فه رمووده كه

(١٥) باوەڕ شەست و ئەوەندە بەشە(پۆلە) یە ، وەشەرمیش بەشێکە لەباوەڕ.

(صەحیحە) (خ) لەئەبی هورەیرەوە ڕیوایەتی کردوە.

(١٦) الإيمانُ بِضعٌ وسَبعُونَ باباً فأدناها إماطَـــةُ الأذى عَـــنِ الطَّريقِ، وأرفعها قول:لاإله إلا الله.

(صحيح) (ت) عن أبي هريرة.

**مانای فه رموده كه**

(١٦) باوەڕ حەفتا و ئەوەندە دەرگایە -بەشەیە- نزمترینیـان لادانی ئەوشتانەیە كەدەبنەوەمایـەی ئـازار بۆخـەڵكی لەسـەر ڕێ. وەبەرزترینیان ووتەی(لاإله إلا الله) یە

(صەحیحە) (ت) لەئەبی هورەیرەوە ڕیوایەتی كراوە.

## ٣- دەربارەی ئیسلام و نیشانەكانی

(١٧) الاسلامُ أن تَشْهدَ أن لاإلهَ إلاّ الله وأَنَ محمداً رسولُ الله وتُقيمَ الصلاةَ وتؤتِيَ الزكاةَ وتَصومَ رَمَضـــانَ وتحـــجَّ البيـــتَ إن إستطعتَ إليه سبيلا.

(صحيح) (م، ٣) عن عمر

**لیكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان**

١- الصلاة: لەزمانەوانیدا پاڕانەوەیە و لەزاراوەی شەرعیشدا، بەو پەرستنە تایبەتی‌یە دەوترێ كەبۆئەنجامدانی بەندە ڕووەو (كعبــة)

رادەوەستێ و بە(الله أكـــبر) دەست پـێ دەكات و بەسـەلام دانـەوە كۆتایی دێت(و).

٢- الزكاة: لەزمانەوانی دا بەمانای پاككردنەوە(الطهارة) و گەشـە كردن (النماء) هاتوە لەزاراوەی شەرعیشدا حەقێكە خوایگەورە لەسەر دەوڵەمەند و ساماندارانی پێویست كردوە كەبیدەن بەچەند كۆمـەڵێك كە ئەوانیش دیاری كراون لە قورئانی پیرۆزدا(و).

٣- الصـــوم: لـە زمانـەوانیدا مانـای خۆگرتنەوەیە، لەشـەرعیشـدا خۆگرتنەوەیە لەخواردن و خۆردنـــەوە و جـووت بـوون لەگـەڵ خێزاندا لەبەری بەیانییەوە تا ئاوابوونی خۆر(و).

٤- حـەج: چونـە بۆمەككـە بەمەبەستی تـەواف كـردن بـەدەوری كەعبـــەدا، لەگـــەڵ وەســـتان لـــەكێوی عەرەفـــە، وەكاتەكـــەی دیاریكراوە(و).

## مانای فەرموودەكە

(١٧) ئیسلام ئەوەیە كەشایەتیبدەی لەســەر ئـەوەی كـەهیچ پەرستراوێك شایان بە پەرستن نییە جگـە لـەخوا وەشـایەتی بدەی لەسەر ئەوەی كە محمد (صلیاللهعلیەوسلم) پێغەمبـەری خوایە، وەنوێژ بكەی و زەكات بدەی و رۆژووی رەمـەزان بگـری و حـەجی مـاڵی خـوا بكەی ئەگەر توانیت رێبگریتەبەر.

(صەحیحە) (م، ٣) لەعومەرەوە ریوایەتیان كردوە

( ١٨ ) إنَّ أوثقَ عُرى الإسلام:أن تُحبَّ في اللهِ وتبُغِضَ في الله.

(حسن) (حم، ش، هب) عن البراء

**ماناى فه رمووده كه**

( ١٨ ) بەڕاستی -بەدڵنیاییەوە- پتەو ترین دەسبەندی ئیسلام ئەوەیە کە هەرچیت خۆش دەوێ لەبەر خوا خۆشت بوێ، وە رقت لەهەر چی ببیتەوە لەبەر خوا ڕقت لیّ ی بیّتەوە .

( حەسەنە ) (حم، ش، هب ) لە بەرائەوە ڕیوایەتیان کردوە

( ١٩ ) المُسلِمُ مَنْ سَلِمَ المسلمونَ مِنْ لسانهِ ويَدِهِ.

(صحيح) (م) عن جابر، و(خ، د، ن) إبن عمر.

**ماناى فه رمووده كه**

( ١٩ ) موسڵمان کەسێکە کە موسڵمانان لەدەست و زمانی پارێزراوبن

( صەحیحە ) ( م ) لەجابرەوە(خ، د، ن ) لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتیان کردوە

( ٢٠ ) لَونزَل موسى فاتّبعتُموهُ وتركْتمُوني لظَلَلتم، أنا حظُّكُم مِنَ النَّبينَ، وأنتمُ حَظّي مِنَ الأمَم.

(حسن) (هب) عن عبد الله بن الحارث.

### ماناى فه رمووده كه

٢٠- ئەگەر موسى(عليـــه الســـلام)دابەزيايـە خـوارەوە (هاتبايـە) شوێنى بكەوتنايە و وازتانيش لە من هێنابا

ئەوا بەدڵنياييەوە گومڕا دەبوون مـن

بەشى ئێوەم لەپێغەمبەران ئێوەش بەشى منن لەئوممەتان،

(حەسەن) (هب) لەعبد الله ى‌كوڕى حارثەوە ڕيوايەتيان كردوە.

## ٤- دەربارەى ناوەكانى خوا و سيفەتەكانى

(٢١) إنّ الله تَعالى عفُو يُحِبُّ العفْوَ.

(حسن) (ك) عن عبدالله مسعود (عد) عن عبدالله بن جعفر

### ماناى فه رمووده كه

(٢١) بەڕاستى خـواى گـەورەو بەبەرز گيراو لێ بووردەيـــە و لێ بووردنيش -لێ بووردەيشى- خۆشدەوێ

(حەسەنە) (ك) لە ئيبنو مەسعودو (عد) لە عبدالله ى كوڕى جەعفەرەوە ڕيوايەتيان كردووە

(٢٢) إنّ الله تَعالى محسنٌ فأَحْسِنوا.

(صحيح) (عد) عن سمرة

### ماناى فەرموودەكە

(٢٢) بەڕاستى خواى گەورە چاكەكارە -دە- ئێوەش چاكە بكەن

(صەحيحە)		(عد) لەسەمورەوە ڕیوایەتیان كردوە.

(٢٣) إسمُ اللهِ الأعظمُ الذي إذا دُعِيَ بهِ أجابَ، في ثلاثِ سورٍ مِنَ القرآنِ، في البقرة وآل عمران، وطه.

(صحيح)		(هـ، طب، ك) عن أبي أمامة.

### ماناى فەرموودەكە

(٢٣) ناوە هەرە گەورەكانى خوا كە ئەگەر پێیان بپاڕێیتەوە لێى وەلام دەداتەوە لەسێ سورەتى قورئاندان،

لەبەقەرەو ئالى عمران و طە:

(صەحيحە) (هـ، طب، ك) لەئەبى ئومامەوە ڕیوایەتیان كردوە.

(٢٤) إن اللهَ هُوَ الحكمُ وإليهِ الحكمُ.

(صحيح)		(د، ن، ك، حب) هانى بن يزيد

### ماناى فەرموودەكە

(٢٤) بەڕاستى خوا هەر خۆى دادوەرە و مافى دادیشى هەر بۆخۆیەتى

(صەحيحە)		(د، ن، ك، حب) لەهانى كوڕى یەزیدەوە.

( ٢٥ ) إنكُم لَن تَروا ربكمْ عز وجلّ حَتى تَموتوا .

(صحيح) (طب في السنة) عن أبي أمامة

**ماناى فه رمووده كه**

( ٢٥ ) ئێوه پەروەردگاری بەعیزەت و بەدەسەلاتتان نابینن تا نەمرن.

( صەحیحە ) ( طب، لەسوننە )دا لەئەبی ئومامەوە ڕیوایەتی کردوە

( ٢٦ ) رأيتُ رَبّيَ عزّوجَلّ.

(صحيح) (حم) عن إبن عباس

**ماناى فه رمووده كه**

( ٢٦ ) پەروەردگاری بەدەسەلاتم بینی(لەخەودا ) وەک لەهەندێ ڕیوایەتی تردا هاتوە.

( صەحیحە ) ( حم ) لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردوە

( ٢٧ ) لَيسَ للهِ شَرِيكٌ.

(صەحيح) (د) عن والد أبي المليح

**ماناى فه رمووده كه**

( ٢٧ ) خوا هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نییە

( صەحیحە ) ( د ) لەوالدی ئەبی مەلیح ڕیوایەتی کردوە

( ٢٨ ) الميزانُ بيدِ الرَّحمٰن يرفع أقواماً ويضعُ آخَرين.

(صحيح) (البزاز) عن نعيم بن همار

## ليكدانەوەى هەنديک لە ووشەکان

١- الميزان: تەرازو (و)

٢- بيـــد: بەدەســـتى: مەبەســت لەدەســت لـــێرەدا دەســـتى راستەقينەيە دەستێک کەشايستەى خواىگەورەيە، بـــەلام شـــێوەو چۆنىيەتەکـــەى نـــازانرێ پێويســـتە وازى لىٚ بهێـــنرێ و بـــيرى لىٚ نەکرێتەوە هەروەها بىٚ ئەوەىبنوێنرێ يان بەهى بەندەکان بچوێـنرێ، سەلەف رەحمەتى خوايان لىٚبىٚ بەوشێوەيە باوەڕيـان بەسيفەتەکانى خوايە(و)، وەيەکێکە لەسيفەتە زاتيەکان

## ماناى فەرموودەکە

( ٢٨ ) تـەرازو بەدەسـتى ( خـواى ) بەخشــندەيە، گـەلانێک بـەرز دەکاتەوەو ، هى تريش دێنێتە خوار.

( صەحيحە ) ( البزار) لەنەعيمى کوڕى هەممارەوە ڕيوايەتى کردوە

( ٢٩ ) يتجلّى لنا ربُّنا ضاحِكاً يومَ القِيامة.

(صحيح) (طب) عن أبي موسى

## ليكدانەوەى هەنديک لە ووشەکان

١-يتجلى: دەردەکەوێ(و)

٢- ضاحكـــا: بەپێکەنینـەوە: پێکـەنینێك کەشایسـتەی خـوای گەورەیــە و یەکێکـە لەسـیفەتە کردایــەکان وە بــێ ئــەوەی بـیر لەچۆنیەتەکـەی بکرێتـەوە، سـەلەف رەحمـەتی خوایـان لێ بـێ بەوشێوەیەدانیان پێدا هێناوە وبەبێ ئەوەی بینوێنن یان بەهی بـەندە کانی بچوێنن

## ماناى فه رمووده كه

( ٢٩ ) لەرۆژیقیامەتدا پەروەردگارمان بەپێکەنینەوە دەردەکەوێ.

( صەحیحە ) ( طب ) لەئەبی موساوە ڕیوایەتی کردوە.

( ٣٠ ) يَضْحَكُ اللهُ إلى رَجُلَين، يقتُلُ أحدُهما الآخَر، يدخُـــلانِ الجنّة، يقاتل هذا في سَبيل الله فيُقتَل، ثُم يتوبُ اللهُ عَلـــى القَـاتِلِ فَيُسلِمُ فيُقاتِلُ في سَبيلِ اللهِ فيَستَشهِد.

(صحيح) (حم، ق، ن، هـــ) عن أبي هريرة.

## ماناى فه رمووده كه

( ٣٠ ) خوای پەروەردگار بەدوو پیاو پێدەکـەنێ، یـەکیان ئـەویتر دەکوژێو ( هـەردوکیان دەچنـە بەهەشتەوە ) ئـەوەیان کەلـەپێناوی خـوادا دەجـەنگێ دەکـوژێ، پاشـان خـوای گـەورە تۆبــە لەبکوژەکــە وەردەگرێو موسڵمان دەبێ ئەوجا لەپێناوی خوادا دەجەنگێ وشەهید دەبێ.

( صەحیحە ) ( حم، ق، ن،هـ ) لەئەبی هورەیرەوە ڕیوایتیان کردوە

## ٥- دەربارەی باوەڕ بون بە قەدەری خوا

(٣١) إن الرِّزقَ ليطلبُ العبدَ اكثرَ مِمَّا يطلبهُ أجلهُ.

(حسن) (طب، عد) عن أبي الدرداء

**مانای فەرموودەکە**

(٣١) بەڕاستی ڕۆزی -ژیوار- زیاتر داوای بەندە دەکات -بە دوایدا دەگەڕێ- لەگەڕانی ئەجەلی بەدوایدا

(حەسەنە) (طب،عد)لەئەبی دەرداوە ڕیوایەتیان کردوە

(٣٢) إن الله لَوشاء أنْ لايعُصى، ماخلقَ إبليس.

(حسن) (حل) عن إبن عمر (هق، البزار، اللالكائي) عن إبن عمرو.

**مانای فەرموودەکە**

(٣٢) بەڕاستی ئەگەر خوای پەروەدگار بیویستبا کە سەرپێچی نەکرێ ئیبلیسی بەدی نەدەهێنا

(حەسەنە) (حل) لەئیبنو عومەر و (هق، البزار، اللالكائي) لەئیبنو عەمرەوە ڕیواتیان کردوە.

(٣٣) خَلَقَ اللهُ يحيى بن زكريّا في بَطْنِ امهِ مؤمناً وخلق فِرعَوْن في بطنِ أمهِ كافراً.

(حسن) (عد، طب) عن إبن مسعود

### مانای فه رمووده که

(٣٣) خوای پەروەدگار یەحیای کوڕی زەکەریای لەسکی دایکی بەباوەڕداری بەدیهێنا، وەفیرعەونی لەسکی دایکیبەبێ باوەڕی بەدی هێنا.

(حەسەنە) (عد،طب) لەئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردوە.

(٣٤) سَيكونُ في أمّتي أقوامٌ يُكذّبونَ بالقدرِ.

(صحيح) (حم، ك) عن إبن عمر

### مانای فه رمووده که

(٢٤) لەمەولا لەئومەتی من گەلانێک پەیدا دەبن قەدەر بەدرۆدەزان

(صەحیحە) (حم، ک) لە ئیبنو عومەرەوە.

(٣٥) كل امرئٍ مُهيأٌ لِما خُلِقَ لهُ.

(حسن) (حم، طب، ك) عن ابن الدرداء

### مانای فه رمووده که

(٣٥) هەموو کارێک ئامادەکراوە بۆ ئەوەی کە بۆی بەدیهێنراوە

(حەسەنە) (حم، طب، ک) لەئەبی دەردائەوە ڕیوایەتیان کردوە

(٣٦) كُل شَيءٍ بِقَدَر حتّى العَجْزُ والكَيْسُ.

(صحيح) (حم،م) عن ابن عمر

**ليكدانه وه ى هه نديك له ووشه كان**

١- العجز: دەستەوەستانی.

٢- الكيس: چالاكی.

**ماناى فه رموود ه كه**

(٣٦) هەمووشـــتێک بەئەندازەگیرییـــە -قـــەدەرە- هـــەتا دەستەوەستانی و چالاکیش

(صەحیحە) (حم، م) لەئیبنو عومەرەوە ڕیواتیان کـردوە

(٣٧) إنَّ اول شَيءٍ خَلَقَهُ الله القَلَمَ، فأمره فكَتَبَ كـــل شَـــيءٍ يكون.

(صحيح) (حل، هق) عن إبن عباس

**ماناى فه رموود ه كه**

(٣٧) یەکـەم شـتێک کـە خـوای پـەروەدگار بـەدیهێنا قەڵـەم بـو، فەرمانی پێکرد، هەرچی شتێک کەدەبێ، نوسی.

(صەحیحە) (حل، هق) لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتیان کردوە.

( ٣٨ ) ما قدرَ في الرَّحِمِ سيَكونُ.

(صحيح) (حم،طب) عن أبي سعيد الزرقي

### لێکدانەوەی هەندێک لەووشەکان

١- قدر: ئەندازەی گیراوە.

٢- الرحم: مەبەست پێی رەحمی دایکە.

### مانای فەرموودەکە

( ٣٨ ) هەرچی لەرەحمدا ئەندازەی گیراوە لەمەولا دەبێ.

( ٣٩ ) ياعائِشةَ إنَّ اللهَ خلقَ لِلجنةِ أهْلاً، خَلقَهمْ لها وهُمْ في أَصْلابِ آبائِهمْ، وخَلقَ للنارِ أَهلاً خَلقَهُم لها وَهُم في اصّلابِ آبائِهم.

(صحيح) (حم، م، د، هـ) عن عائشة

### مانای فەرموودەکە

( ٣٩ ) ئەی عائشە بەدڵنیایی خوای پەروەدگار کەسانێکی بۆ بەهەشت بەدیهێناون، بەدیهێناون بۆی لەکاتێکدا ئەوان لەپشتی باوکیاندا بون، وەبۆئاگر کەسانێکی بەدیهێناون، بەدیهێناون بۆی لەکاتێکدا ئەوان لەپشتی باوکیان دا بون.

( صەحیحە ) ( حم، م، د، هـ ) لەعائشەوە ریوایەتیان کردووە.

(٤٠) لَو أنَّ إبنَ آدم هَرَبَ مِنْ رِزْقِهِ كما يهْربُ مِـــنَ المَـــوت، لأدرَكهُ رِزقُه كما يُدرِكُه المَوْتُ.

(حسن) (حل) عن جابر

**ماناى فه رموود ه كه**

(٤٠) ئەگەر چی ئادەمیزاد لەبەر ڕۆزی -ژیوار-ەکـەی ڕاکا وەکـو چۆن لەمردن ڕادەکا، بەدڵنیاییەوە بژیوەکەی دەگاتێ هـەروەکو چـۆن مردنی دەگاتێ.

(حەسەنە) (حل) لەجابرەوە ڕیوایەتی کردووە

## ٦- دەربارەی وەسوەسە

(٤١) تَفَكَّرُوا فى خَلقِ الله وَلاتفكرّوا فى الله.

(حسن) (حل) عن إبن عباس

**ماناى فه رموود ه كه**

(٤١) بیر لەبەدی هێنراوەکانی خوا بکەنەوەو بیر لەخوامەکەنەوە

(حەسەنە) (حل) لەئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە.

## ٧- دەربارەی گەورەیی زانست و زانیاری

(٤٢) سَلوا اللهَ عِلْماً نافعاً، وتعوذوا بالله مِنْ عِلمٍ لايَنفعْ .

(حسن) (هـ،حب) عن جابر

**ماناى فەرموودەكە**

(٤٢) داوا لەخوا بكەن بۆ زانيارى سودمەند، وە پەنابگرن لە زانيارى بێ سوود.

(حەسەنە) (هـ، حب) لەجابرەوە

(٤٣) صاحبُ العِلْمِ يَسْتغفرُ له كل شيءٍ حتّى الحُوتُ في البَحرِ.

(صحيح) (ع) عن أنس، (ت) عن أبى أمامة

(٤٣) خاوەنى زانيارى هەموو شتێك داواى لێ خۆش بونى بۆدەكەن، هەتا نەهەنگيش لەناودەريادا

(صەحيحە) (ع) لەئەنەس و (ت) لەئەبى ئومامەوە ريوايەتيان كردوە

(٤٤) طَلبُ العِلْمِ فريضةٌ على كُلِّ مُسلمٍ.

(صحيح) (عد،هب) عن انس (طص، قط) عن الحسين بن على (طس) عن ابن عباس

### مانای فەرموودەکە

( ٤٤ ) داواکردنی زانست و بەدوادا گەڕان و فێربونی لەسەر هەموو موسڵمانێک پێویستە.

( صەحیحە )    ( عد، هب ) لە ئەنەسەوە ( طس، قط ) لە حوسەینی کوڕی عەلی‌یەوە، ( طس ) لەئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە.

( ٤٥ ) فَضْلُ العالِمِ على العابِدِ كفَضْلِ القَمرِ ليلةَ البَدْرِ على سائرِ الكواكبِ.

(صحيح)    (حل) عن معاذ

### مانای فەرموودەکە

( ٤٥ ) ڕێزو گەورەیی زانا بەسەر خواپەرستدا وەکو ڕێزو گەورەیی مانگی شەوی چواردەیە بەسەر تێکڕای ئەستێرەکاندا.

( صەحیحە )    ( حل ) لەمەعازەوە ڕیوایەتیان کردووە

( ٤٦ ) إنَّ الدالَّ على الخيرِ كفاعلِهِ.

(صحيح)    (ن) عن أنس

### مانای فەرموودەکە

( ٤٦ ) بەدڵنیایی‌یەوە ئەوکەسەی ڕێنێشاندەری چاکەیە وەکو چاکەکارەکە وایە.

( صەحیحە )    ( ت ) لەئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە

( ٤٧ ) معلم الخَيرِ يَستغفِرُ لهُ كلُّ شَيءٍ حتّى الحيتانُ في البَحرِ.

(صحيح) (طس) عن جابر، (البزار) عن عائشة

**مانای فه رمووده که**

( ٤٧ ) فێرکاری چاکه هه موو شتێک داوای لێ خۆشبونی بۆده کا، هه تا نه هه نگیش له ده ریادا.

( صه حیحه ) ( طس ) له جابره وه، ( البزار ) له عائیشه وه ریوایه تیان کردووه

( ٤٨ ) مَنْ يردِ اللهُ بهِ خيراً يفقّهه في الدينِ.

(صحيح) (حم، ت) عن معاوية

**مانای فه رمووده که**

( ٤٨ ) خوای گه وره چاکه ی بۆ هه رکه سێک بوێت له ئایین شاره زای ده کا .

( صه حیحه ) ( حم،ت ) له معاویه وه ریوایه تیان کردووه

( ٤٩ ) قَتلوهُ قتلهمُ اللهُ، ألاسألوا إذا لم يَعْلَموا فإنَّما شفاءُ العِيِّ السؤالُ؟ إنما كانَ يكيفيه أن يتيَمَّمَ.

(صحيح) (د) عن جابر

### ماناى فەرموودەكە

( ٤٩ ) كوشتيان خوا بيان كوژێ، نەدەبا پرسيار بكەن گەر نەيان دەزانى ، تەنيا چارەسەرى نەزانى ( جهل ) پرسيار كردنە، بەسى بوكە تەيەموم بكا.

( صەحيحە )                ( د ) لەجابرەوە ريوايەتى كردوە

( ٥٠ ) مِثْلُ العالِمِ الذي يعلِّمُ النّاسَ الخيرَ وينْسى نفسَهُ كمثَلِ السِّراجِ يُضيءُ للناسِ، ويحرقُ نفسَهُ.

(صحيح)                (طب، والضياء) عن جندب

### ماناى فەرموودەكە

( ٥٠ ) وێنەى ئەو زانايەىكە خەڵكى فێرى چاكە دەكاو خۆى لەبيرچوە، وەكو وێنەى چرايەكە بۆ خەڵكى دادەگيرسێ و ڕێ ڕۆشن دەكاتەوە، وەخۆى دەسوتێنێ .

( صەحيحە )                ( طب، والضياء ) لەجندبەوە ريوايەتيان كردوە.

( ٥١ ) علمٌ لاينفع ككنزٍ لاينفقُ مِنهُ.

(صحيح)                (القضاعى) عن إبن مسعود

## ماناى فه رمووده كه

( ٥١ ) زانیاری كه سودی نه‌بێ وه‌كو خه‌زنه‌یه‌ك وایه كه خێری لێ نه‌كرێ.

( صه‌حیحه ) ( القضاعي ) له‌ئیبنو مه‌سعوده‌وه ریوایه‌تی كردووه

( ٥٢ ) مَنْ كتم عِلْماً عَنْ اهلهِ أَلجِمَ يومَ القيامةِ لجاماً مِنْ نار.

(صحيح) [illegible]

## ماناى فه رمووده كه

( ٥٢ ) هه‌ركه‌سێ زانستێك بشارێته‌وه له‌وكه‌سانه‌ی كه‌شایسته‌ن پێی ( ئه‌هلن بۆ ئه‌و زانسته )، له‌ڕۆژی دوایدا لغاو ده‌كرێ، به‌لغاوێك له ئاگر .

( صه‌حیحه ) ( عد )له‌ئیبنو مه‌سعودو ( حب، ك ) له ئیبنو عه‌مره‌وه ریوایه‌تیان كردوه

( ٥٣ ) قيِّدوا العِلمَ بالكتاب.

(صحيح) (طب، ك) عن إبن عمر

## ماناى فه رمووده كه

( ٥٣ ) زانیاری په‌یوه‌ست كه‌ن به‌نوسینه‌وه.

( صه‌حیحه ) ( طب، ك ) له‌ئیبنو عه‌مره‌وه ریوایه‌تیان كردووه.

(٥٤) المتمسكُ بِسنتي، عِنْدَ إختلافِ أمتي كالقابِضِ على الجمرِ

(حسن) (الحكيم) عن إبن مسعود

## ماناى فه رمووده كه

(٥٤) ئەوكەسەى دەستى دەگرێ بەسونتەتی من لەكاتی جیاوازیو دوبەرەكی ئۆمەتەكەم دا وەكو ئەوە وایە چنگی لەسەر بشكۆگیرکردبێ (چنگی لەبشكۆ گیرکردبێ) .

(حەسەنە) (الحكيم) لەئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەتی كردوە.

## ٨- دەربارەی درۆكردن بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ)

(٥٥) إن الذى يكذبُ عليَّ يُبنى له بيتٌ في النار .

(صحيح) (حم) عن إبن عمر

## ماناى فه رمووده كه

(٥٥) ئەوەی كەبەدەم منەوە درۆدەكا ماڵێكی بۆ دروست دەكرێ لەناو ئاگردا.

(صەحیحە) (حم) لەئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی كردوە.

(٥٦) مَنْ كَذَبَ عليَّ متعمداً فليتبوأْ مقعدَهُ مِنَ النار.

(صحيح متواتر) (حم، ت، ق، ن، هـ) عن أنس

**ماناى فه رمووده كه**

(٥٦) هەرکەسێك بەئەنقەست بەدەم منەوە درۆیەك بکا باجێ‌یەك بۆ خۆی دانێ لەناو ئاگردا.

(صەحیحە متەواترە) (حم، ق، ت، ن، هـ) لەئەنەسەوە

## ٩- دەربارەی جیاوازی لەنێوان ئەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی سەربارەت بەکاروباری دین و کاروباری دنیا

(٥٧) إذا كانَ شَئٌ مِنْ أمرِ دنياكُمْ فأنتم أَعْلَمُ بِهِ وإذا كانَ شَيءٌ مِنْ أمرِ دينِكُمْ فإليَّ.

(صحيح) (حم، م) عن أنس وعائشة

**ماناى فه رمووده كه**

(٥٧) ئەگەر شتێك بوو لەبارەی کاروباری دنیاکەتان ئێوە زاناترن پێی وەئەگەر شتێك بوو لەبارەی کاروباری دینەکەتان ئەوە بۆلای منە.

(صەحیحە) (حم، م) لەئەنەس وعائشەوە ریوایەتیان کردوە.

( ٥٨ ) إنّما أنابشر إذا أمَرتُكمْ بِشَيءٍ منْ دينِكُمْ فخذُوا بِـــهِ وإذا أمرتُكُمْ بِشيءٍ منْ رأيي، فإنما أنا بشر.

(صحيح) (م،ن) عن رافع بن خديج

**ماناى فه رمووده كه**

( ٥٨ ) منيش تەنياو بەس مرۆڤم، گەر فەرمانم پێ كـردن بەشـتێك دەربارەی دینەكەتان وەری بگرن، وەئەگەر فەرمانم پێكردن بەشـتێك لەبۆچوونی‌خۆم، ئەوا منيش تەنيا و بەس مرۆڤم.

( صحیحە ) ( م، ن ) لەرافیعی كوڕی خەدیجەوە ریوایەتیان كردوە.

## ١٠- دەربارەی گەورەیی قورئان و خوێندن و فێر بوونی

( ٥٩ ) أقرَؤوا القُرآنَ، فإنكم تؤْجَرون عَلَيهِ، أماّ إنيّ لا أقـــولُ (الم) حَرْفٌ، ولكِنْ الفُ عشْرٌ، ولامٌ عَشْرٌ، وَميمٌ عَشْـــرٌ، فَتِلْـكَ ثلاثون.

(صحيح) (خط) عن إبن مسعود.

### ماناى فەرموودەكە

( ٥٩ ) قورئان بخوێنن، بەدڵنیاییەوە پاداشتی لەسەر وەردەگرن من ناڵێم( ألم ) پیتێکە، بەڵکو( ألف ) دەخێرە و ( لام ) دەیە و ( میـــم ) دەیە ئەوە سی خێری تەواو.

( صەحیحە ) ( خط ) لە ئیبنو مەسعودەوە.

( ٦٠ ) خَيرُكُم مَنْ تعلَّمَ القُرآنَ وَعلَّمَهُ.

(صحيح) (خ،ت) عن علي، (حم، ت،د،هــ)عن عثمان .

### ماناى فەرموودەكە

( ٦٠ ) باشترینتان کەسێکە قورئان فێربێ‌وخەڵکیش فێرکا.

( صحیحە ) ( خ،ت ) لەعەلیەوە، ( حم، ت، د، هـ ) لەعوثمانەوە ریوایەتیان کردووە

( ٦١ ) يُقالُ لِصاحبِ القُرآن إذا دَخَلَ الجنّة إقرأْ وأصعَد فيقْــرأْ ويَصْعَدْ لكل آيةٍ درَجة، حتَىّ يقرأ آخر شَيءٍ معه.

(صحيح) (حم،هــ) عن سعيد

### ماناى فەرموودەكە

( ٦١ ) بەخاوەن قورئان -ئەو کەسەی قورئـانی لەبەرە- دەوترێ کـاتێک چـووە بەهەشـتەوە: بخوێنـــەوەو بەرزبـــەوە، ئـــەویش دەخوێنێتـەوەو بـەرز دەبێتـەوە بۆهـــەموو ئایـــەتێک پلەیـــەک، هـــەتا دواترین شت دەخوێنێ کەلەگەڵیایە- لەبەریەتی-.

( صەحیحە ) ( حم، هــ ) لەسەعیدەوە

## ١١- دەربارەیی گەورەیی سورەتەکان

(٦٢) أفضلُ القرآن (الحمد لله رب العالمين).

(صحيح) (ك،هب) عن أنس

### مانای فەرموودەکە

(٦٢) گەورەترین سورەتی قورئان (الحمد لله رب العالمين)ە.

(صەحیحە) (ك،هب) لەئەنەسەوە.

(٦٣) إقرؤوا سورةَ البقرة في بيوتِكُم، فإن الشَّيطانَ لايَدخُلُ بيتاً يُقرأ فيهِ سورةُ البقرة.

(صحيح) (ك، هب) عن إبن مسعود

### مانای فەرموودەکە

(٦٣) سورەتی (البقرة) بخوێنن لەماڵەکانتاندا چونکە شەیتان ناچێتە ماڵێکەوە سورەتی (البقرة)ی تێدا بخوێنرێ.

(صحيحة) (ك، هب) لەئیبنو مەسعودەوە.

(٦٤) إقرؤوا هاتَينِ الآيتَينِ اللّتينِ في آخِرِ سورةِ البَقَرة، فإنّ رَبّي أعطانيهِما مِنْ تحتِ العَرشِ.

(صحيح) (حم، طب) عن عقبة بن عامر

**ماناى فەرموودەكە**

( ٦٤ ) ئەو دوو ئايەيەتە بخوێنن كەلەكۆتايى سورەتى ( البقرة)دان، چونكە پەروەردگار لەژێر عەرشەكەيەوە ئەم دوانەى پێ بەخشیوم.

( صەحيحە )　　　　( حم، طب ) لەعوقبەى كوڕى عامرەوە.

**( ٦٥ ) شَيَّبَتْنِي هود، والواقعة، والمرسَلات، وعمَّ يتَسَاءلون، وإذا الشَّمسُ كُوِّرت.**

(صحيح)　　　　(ك، ت) عن إبن عباس

**ماناى فەرموودەكە**

( ٦٥ ) پيرى كردم سورەتى ( هود ) و ( الواقعه ) و ( المرســـــلات ) و (عم يتسألون ) و(إذا الشمس كورت ).

( صە حيحە )　　　　( ك، ت ) لەئيبنو عەباسەوە

**( ٦٦ ) مَنْ قَرَأَ (قُلْ هُوَ اللهُ أحدٌ) فَكأنَّمَا قَرَأَ ثُلُثُ القُرآن.**

(صحيح)　　　　(حم، ن، الضياء) عن أبيّ

**ماناى فەرموودەكە**

( ٦٦ ) هەركەسێ ( قل هو الله أحـــــد ) بخوێنێ وەكو ئەوە وايە سێ‌يەكى قورئانى خوێندبێ.

( صە حيحە )　(حم، ن، والضياء) لە ئوبەيەوە ريوايەتيان كردووە

(٦٧) مَنْ حفِظَ عشْرَ آياتٍ مِنْ أولِ سورةِ الكهفِ عُصِمَ مِنْ فِتنةِ الدّجال.

(صحيح) (حم، م، د، ن) عن أبي درداء

**ماناى فه رمووده كه**

(٦٧) هه‌ركه‌سێك ده‌(١٠) ئايه‌تى يه‌كه‌مى سوره‌تى (الكهـــف) له‌به‌ركا له‌به‌لاى (ده‌جال) پارێزراوه.

(صه حيحه) (حم، م، د، ن) له‌ئه‌بى ده‌ردائه‌وه ريوايه‌تيان كردووه.

(٦٨) مَنْ قرأَ آيةَ الكرسي دُبُرَ كلِّ صلاةٍ مكتوبةٍ لم يمنعْهُ مِـــنْ دخولِ الجنة إلاّ أن يموتَ.

(صحيح) (ن، حب) عن ابي أمامة

**ماناى فه رمووده كه**

(٦٨) هه‌ركه‌سێك (آية الكرسى) بخوێنێ له‌دواى هــه‌موو نوێژێكـى فه‌رز، به‌رگريه‌ك قه‌ده‌غه‌ى ناكا له‌چونه به‌هه‌شته‌وه جگه له‌مردنى.

(صه حيحه) (ن، حب) له‌ئه‌بى ئومامه‌وه ريوايه‌تيان كردووه.

(٦٩) لَن تَقْرأَ شيئاً أبلَغَ عِندَ الله مِنْ (قل أعوذ برب الفلق).

(صحيح) (ن) عن عقبة بن عامر

### ماناى فەرموودەكە

( ٦٩ ) هیچ شتێك ناخوێنرێتەوە پاراوتریێ لای خوا لە ( قل أعـــوذ برب الفلق ).

(صه حیحه) (ن) لە عوقبەی كوڕی عامرەوە.

## ١٢- دەربارەی ئادابی خوێندنەوەی قورئان

( ٧٠ ) أحسَنُ النّاسِ قِراءةً الّذي إذا قَرَأَ رأيتَ أنهُ يَخشى الله.

(صحيح) (هب، خط) عن إبن عباس (خط) عن إبن عمر (فر) عن عائشة.

### ماناى فەرموودەكە

( ٧٠ ) چاكترینی قورئان خوێن -لەناو خەڵكیدا- ئەو قورئان خوێنەیە كاتێك قورئان دەخوێنێتەوە لەخواترسانی تێدا بەدی كەی.

(صه حیحه) (هـــب،خـــط) لەئیبنو عەباسەوە (خـــط) لەئیبنو عومەرەوە ( فر ) لەعائیشەوە.

( ٧١ ) زَيّنوا القرآنَ بِأصْواتِكُم.

(صحيح) (حم، د، ن، هـــ، حب، ك) عن البراء

## ماناى فه رمووده كه

( ٧١ ) قورئان براز بێننه‌وه به‌ده‌نگه‌كانتان .

( صه‌حيحه )                    (حم، د، ن، هـ، حب،ك ) له‌به‌رائه‌وه .

**( ٧٢ ) كان لايقرأ القرآن في أقل مِنْ ثلاث.**

(صحيح)                    (إبن سعد) عن عائشة

## ماناى فه رمووده كه

( ٧٢ ) پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) به‌ته‌واوى قورئانى نه‌ده‌خوينده‌وه به‌كه‌متر له‌سێ ڕۆژ.

( صه‌حيحه )                    ئيبنو سه‌عد له‌عائيشه‌وه .

**( ٧٣ ) كان إذا مرَّ بآيةِ خوفٍ تعوَّذَ، وإذا مرَّ بآيةِ رحمةٍ سأَلَ، وإذا مرَّ بآيةٍ فيها تنزيهُ الله سبَّحَ.**

(صحيح)                    (حم، م، ٤) عن حذيفة

## ليكدانه‌وه‌ى هه‌نديك له‌ووشه‌كان

١- مر: تێپه‌ڕيايه، له‌كاتێ خويندنه‌وه ( و ) .

٢- بآية خوف: به‌سه‌ر ئايه‌تێك دا كه‌باسى سزاى تێدابوايه ( و ) .

٣- بآية رحمة: به‌سه‌ر ئايه‌تيكدا كه‌باسى ره‌حمه‌تى خواى كردبايه . ( و )

٤- بآية فيها تنزيه: بەسەر ئایەتێک دا کەباسی پـاک گرتنـی خـوای کرد لەهاوەڵ و وەچەو ..هتد (و).

## مانای فەرموودەکە

( ٧٣ ) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بەسەر ئایـەتێکی سـزادا تێ‌پەڕیایە پەنای بەخوادەگرت، وە ئەگەر بەسەر ئایـەتێکی بـەزەیی‌دا تـێ پەڕیایـە داوای ئـەو بەزەیی‌یـەی لـەخوا دەکـرد ئەگـەر بەسـەر ئایەتێکدا تێپەڕیبا باسـی بەپاک گرتنـی خـوای تێدابا خـوای بـەپاک دەگرت (سـبحان الله)ی دەکرد.

(صـه حیحه) (حم، م، ٤) لە حوزەیفەوە.

( ٧٤ ) إقرأ القرآن في ثلاثٍ إنِ أستطعت .

(صحيح) (حم، طب) عن سعدبن المنذر

## مانای فەرموودەکە

( ٧٤ ) ئەگەر توانیت لە ماوەی سێ ڕۆژدا هەموو قورئـان بخوێنـی، بیخوێنە.

(صـه حیحه) (حم، طب) لەسەعدی کوڕی مونزیرەوە.

( ٧٥ ) لايفقه من قرأ القرآن في أقل من ثلاث.

(صحيح) (د، ت، هـــ) عن إبن عمر

## مانای فه‌رمووده‌که

( ٧٥ ) له‌قورئان ناگات كه‌سێک به‌كه‌متر له‌سێ ڕۆژ هه‌موو قورئان بخوێنێ .

( صه حیحه ) (د، ت، هـ ) له‌ئیبنو عومه‌ره‌وه .

## ١٣- ده‌رباره‌ی نه‌هی كردن له‌ده‌مه‌وه‌ری

(٧٦) ماضلَّ قومٌ بعدَ هدىً كانوا علَيهِ اِلا اُوتوا الجَدَلَ.

(حسن) (حم، ي، هــ، ك) عن إبی امامة

## مانای فه‌رمووده‌كه

( ٧٦ ) هیچ گه‌لێک گومڕا نه‌بوه دوای ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر ڕێنمایی بوون، جگه له‌وه‌ی كه‌وتوونه‌ته ده‌مه‌وه‌ریكردن.

( حه‌سه‌نه ) (حم، ت، هـ، ك ) له‌ئه‌بی ئومامه‌وه .

## ١٤- دەربارەی حوكمی هەڵگرتنی قورئان و سەفەر كردن پێی

( ٧٧ ) نَهى أن يسافَر بالقرآنِ إلى أرضِ العدوِّ.

(صحيح) (ق،د،هـ) عن إبن عمر

### مانای فەرموودەكە

( ٧٧ ) پێغەمبەر (صلى‌الله‌عليه‌وسلم) نەهی كردوە لەوەی كەبەقورئانەوە سەفەر بكرێ بۆ زەویەك كە دوژمنی لێ بێ.

( صەحیحە ) ( ق، د، هـ ) لە ئیبنو عومەرەوە.

( ٧٨ ) لايَمَسُّ القُرآنَ إلاّطاهرٌ.

(صحيح) (طب) عن إبن عُمر

### لێكدانەوەی هەندێك لەووشەكان

١) طاهر: پاك، مەبەستی لەموسڵمانە ٠

### مانای فەرموودەكە

( ٧٨ ) دەست لە قورئان نەدا مەگەر كەسێك موسڵمان بێت.

(صەحیحە ) ( طب ) لە ئیبنو عومەرەوە.

## ١٥- دەربارەی سیفەتی مرۆڤ

(٧٩) ليس شئٌ إلاّ وهو أطوعُ لله تعالى من إبنِ آدمَ.

(صحيح) (البزار) عن بريدة

**مانای فەرموودەکە**

( ٧٩ ) هیچ شتێک نیە(ئیلا ) مەگەر ئەو شتە گوێڕایەڵ تربێ بۆ خوایگەورە لە ئادەمیزاد.

(صەحیحە) (البزار) لە بورەیدەوە

( ٨٠ ) مَثَلُ القَلْبِ مِثْلُ الريشةِ تُقلّبُها الرِّياحُ بفلاةٍ.

(صحيح) (هـ) عن أبي م

**مانای فەرموودەکە**

( ٨٠ ) وێنەی دڵ وێنەی پەڕە موچێکە کەبا دەیهێنێ و دەیبا لە بیابانێکدا.

( صەحیحە ) (هـ ) لە ئەبی موساوە

( ٨١ ) إنَّ القُلوبَ بينَ أصْبَعَينِ مِنْ أصابعِ اللهِ يُقلّبُها.

(صحيح) (حم، ت، ك) عن أنس

## لێكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

١- القلوب: دڵەكان (و)

٢- أصبعـــين: دوو پەنجە: هەڵبەتە مەبەست لەپەنجە پەنجەی راستەقینەیە، بەڵام باس كـردن لـە شێوە و چۆنی‌یەتیان قەدەغەیە، یاخود پرسین لێیان، پەنجەیەكیش كەشایستەیە بەزاتی پەروەردگار بێ نواندن و چۆاندنی بەهی بەندەكان (و).

## مانای فەرموودەكە

(٨١) بەراستی -بەدڵنیایی‌یەوە- دڵـەكان لـەنێوان دووپەنجەدان لەپەنجەكانی خوا، دەیانگۆڕێ.

(صەحیحە) (حم، ت، ك) لە ئەنەسەوە.

## ١٦- ئەوەی دەربارەی جنۆكە هاتووە

(٨٢) الجِنّ ثلاثة أصنافٍ، فصِنفٌ لهم أجنِحة يطيرون بِهـــا في الهواءِ، وصِنف حيّات وكِلاب، وصنف يحلون ويظعنونَ.

(صحيح) (طب، ك، والبيهقي في (الاسماء) عن ابي ثعلبة الخشني).

## لێكدانەوەی هەندێك لە ووشەكان

١) يحلون و يظعنون: دەمێننەوەو دەڕۆن

**ماناى فه رمووده كه**

(٨٢) جنۆكه سێ پۆلن: پۆلێكیان باڵیــان هەیـە و پـێ ی دەفـڕن، وەپۆلێكیان مارو سەگن، وەپۆلێكیان دێن و دەڕۆن.

(صه حیحه) (طب، ك، والبیهقـــــي في الاسمــاء) لـه ئـەبی ئەعلەبەی خوشەنی‌یەوە ریوایەتیان كردووه.

## ١٧- حوكمى ئاو و بەكارهێنانى

(٨٣) الماءُ لاینجسهُ شيءٌ.

(صحيح) (طس) عن عائشة

**ماناى فه رمووده كه**

(٨٣) ئاو هیچ شتێك پیسی ناكا.

(صەحیحە) (طس) لەعائیشەوە.

(٨٤) الماء طَهورٌ لاینجسهُ شيءٌ.

(صحيح) (حم) عن أبي سعيد (ن، حب، ك) عن إبن عباس

**ماناى فه رمووده كه**

(٨٤) ئاو پاكە و پاككەرەوەیە هیچ شتێك پیسی ناكات.

(صەحیحە) (حم) لەئەبی سەعید (ن، حـب، ك) لـه ئیبنو عەباسەوە

**( ٨٥ ) البَحرُ الطَّهورُ ماؤهُ، الحِلُّ ميتتهُ.**

(صحيح) (هـ) عن أبي هريرة.

**مانای فه رمووده كه**

( ٨٥ ) دەریا ئاوەکەی پاکەو پاککەرەوەیە، مردارەوە بوەکەی حەلالە.

( صەحیحە ) ( هـ ) لەئەبی هوردیرەوە.

**( ٨٦ ) كان يُصغي للهرَّةِ الإِناءَ، فتشرَبُ، ثم يتوضأُ بفضلِها.**

(صحيح) (طس، حل) عن عائشة

**مانای فه رمووده كه**

( ٨٦ ) پێغەمبەر( صلی‌الله‌علیه‌وسلم ) قاپی ئاوی لەپشیلە نزیك دەکردەوە، -پشیلەکە- لیّی دەخواردەوە پاشان دەست نوێژی دەگرت لەبەرماوەکەی.

( صەحیحە ) (طس، حل ) لەعائیشەوە.

## ١٨- حوكمى پيسىيه‌كان

( ٨٧ ) إذا دُبِغَ الإهابُ فقد طَهُرَ.

(صحيح) (م، د) عن إبن عباس

**ماناى فه‌رمووده‌كه**

( ٨٧ ) ئه‌گه‌ر پێسته خۆش كرا به‌دڵنیایی‌یه‌وه پاك بۆته‌وه ٠

( صه‌حيحه ) ( م، د ) له ئیبنو عه‌باسه‌وه

( ٨٨ ) إذا ولَغَ الكلبُ في إناءِ أحدِكُمْ فليرِقْهُ، ثمَّ ليغسلهُ سبعَ مراتٍ.

(صحيح) (م، ن) عن أبي هريرة

**ماناى فه‌رمووده‌كه**

( ٨٨ ) ئه‌گه‌ر سه‌گێك ده‌مى خسته قاپى هه‌ر يه‌كێكتانه‌وه بابيرێژێ پاشان با حه‌وت جار بيشوات.

( صه‌حيحه ) ( م، ن ) له‌ئه‌بى هوره‌يره‌وه

( ٨٩ ) ذكاةُ الميتةِ دباغها.

(صحيح) (ن) عن عائشة

## لیکدانەوەی هەندێک لە ووشەکان

(١) ذکاة: پاک بونەوە.

(٢) المیتة: مردارەوەبو(و)

## مانای فەرمودەکە

(٨٩) پاک بونەوەی -پێستی- مردارەوەبو خۆشکردنیەتی .

(صەحیحە) (ن) لەعائیشەوە.

(٩٠) يُنضَحُ بولُ الغلام ويُغسلُ بولُ الجارية.

(حسن) (ت،ك) عن علي

## مانای فەرموودەکە

(٩٠) شوێن میزی کورپێژگەی ساوای شیرە خۆرە ئاو پرژێن دەکرێ، وە شوێن میزی کچپێژگەی ساوای شیرە خۆرە دەشۆردرێ.

(حەسەنە) (ت،ك) لەعەلیەوە

## ١٩- دەربارەی قاپ و قاچاخی ئەهلی کتاب

(٩١) إنْ وَجَدتُمْ غيرَ آنيتِهمْ (يعني أهل الكتاب) فَـلا تَـأكلوا فيها، فإن لم تَجِدوا فاغسِلوها، وكلوا فيها.

(صحيح) (ت) عن أبي ثعلبة الخشني

**مانای فەرموودەکە**

(٩١) گەر غەیری قاپ و کەوچکی ئەوانتان (مانای هی ئەهلی کتاب) تان دەست کەوت، تیایاندا مەخۆن وەئەگەر دەستان نەکەوت بیانشۆن، وەتێیاندا -خواردن- بخۆن.

(صەحیحە) (ت) لەئەبی سەعلەبەی خۆشەنییەوە

## ٢٠- دەربارەی ئادابەکانی دەست بەئاوگەیاندن

(٩٢) أتقوا اللاعنَينِ: الذي يتخلى في طريـقِ النّـاس أو في ظِلِّهِمْ.

(صحيح) (حم، م، د) عن أبي هريرة

**مانای فەرموودەکە**

(٩٢) خۆتان بپارێزن لە دوو نەفرین لێکراوەکان ئەودووکارەی دەبنە مایەی نەفرینی خەڵکی لەوکەسەی دەیانکات ئەوەی کەخۆی خاڵی دەکات یان لەسێ بەرەکانیان لە سەر ڕێی خەڵکی.

(صەحیحە) (حم، م، د) لەئەبی هورەیرەوە

(٩٣) أكثرُ عذابِ القبرِ مِنَ البولِ.

(صحيح) (حم، هـ، ك) عن أبي هريرة

**ماناى فه رمووده كه**

زۆرترینی سزای گۆر لە -سۆنگەی- میزەوەیە ٠

(صه حیحه) (حم، هـ، ك) لەئەبی‌هورەیرەوە.

(٩٤) إذا رأيتني على مثل هذه الحالة -يعني البولَ- فلا تُسلِّمْ عليَّ ؛ فإنك إنْ فعلتَ ذلكَ لم أَردَّ عليكَ.

(صحيح) (هـ) عن جابر

**ماناى فه رمووده كه**

(٩٤) گەر منت بینی لە شێوەی ئەو حاڵەتەدا مانای لە -کاتی میزکردنا- سەلامم لێ مەکە، خۆ ئەگەر تۆ ئەوەت کرد- سەلامت لێ کردم- وەڵامت نادەمەوە.

(صەحیحە) (هـ) لەجابرەوە ٠

(٩٥) إنما أنا لكم بمنزلةِ الوالد ، أُعلِّمكُمْ فإذا أتى أحدُكم الغائطَ، فلا يستقبلِ القبلةَ ولا يستدبرها، ولايستطب بيمينهِ.

(حسن) (حم، د، ن، هـ حب) عن أبي هريرة

## ماناى فه رموود ه كه

( ٩٥ ) من بەتەنياو بەس بۆ ئێوە لەشوێنى باوكم فێرتان دەكەم ، ئەگەر يەكێكتان بۆ خۆخاڵى كردن هاتەسەر ئاو، باڕووەو ڕوگەدانەنيشێ وەبا پشتيشى تێ نەكا ، وەبا بەدەستى ڕاستيش خۆى پاك نەكاتەوە .

( حەسەنە ) (حم،د، ن، هـ، حب ) لەئەبى هورەيرەوە.

( ٩٦ ) كانَ إذا أرادَ الحاجة أبعد.

(صحيح) (حم، ن، هـ) عن عبد الرحمن بن أبي قراد

## ماناى فه رموود ه كه

( ٩٦ ) ئەگەر ويستباى خۆى خاڵى بكا دەست بەناو بگەيەنێ زۆر دور دەكەوتەوە.

(صەحيحە) (حم،ن، هـ) لەعەبدولرەحمانى كورى ئەبى قەراد .

(٩٧) نهى أن يُستَنْجى ببعرةٍ أو عَظْمٍ.

(صحيح) (حم، م،د) عن جابر

## ماناى فه رموود ه كه

( ٩٧ ) نەهى كردوە لەوەى كە خۆپاك بكەنەوە بەقشپڵ يان بەئێسك.

(صە حيحە) (حم،م، د) لەجابرەوە

(٩٨) نهى أن يبال في الماءِ الراكدِ.

(صحيح) (م، ن،هــ) عن جابر

**ماناى فه رمووده كه**

(٩٨) نه‌هی کردوه له‌وه‌ی که‌میز بکرێته ئاوێکی ڕاوه‌ستاوه‌وه.

(صه حیحه) (م، هـ، ن) له‌جابره‌وه.

(٩٩) لايبولنّ أحدكُم في الماءِ الدائم ثم يتوضّأُ منه.

(صحيح) (حم،ت،ن) عن أبي هريرة

**ماناى فه رمووده كه**

(٩٩) باهیچ کامێک له‌ئێوه میز نه‌کاته ئاوێکی ڕاوه‌ستاوه‌وه، پاشان ده‌ست نوێژی لێ بگرێ.

(صه حیحه) (حم، ت، ن) له‌ئه‌بی هوریره‌وه.

(١٠٠) لايبولنّ احدكم في الماءِ الدائمِ الذي لا يجري، ثم يغتسلُ فيهِ.

(صحيح) ( ق ، د ، ن) عن أبي هريرة

**ماناى فه رمووده كه**

(١٠٠) با هیچ کام له ئێوه میز نه‌کاته ئاوێکی به‌رده‌وام که له‌به‌ری نه‌ڕوا، پاشان خۆی تێدا بشوات.

(صه‌حیحه) (ق ، د ، ن ) له ئه‌بی هوره‌یره‌وه

(١٠١) كان إذا أراد الحاجة لم يَرفعْ ثوبهُ حتى يَدنوَمِنَ الأرض.

(صحيح) (د ، ت) عن انس و عن ابن عمر(طس) عن جابر

## ماناى فەرموودەكە

(١٠١) كاتێك دەیویست دەست بە ناو بگەیێنێ و دەیویست پێویستەكانی جێبەجێ بكات پۆشاكەكەی بەرز نەدەكردەوە تا لە زەوی نزیك دەبۆوە.

(صەحیحە) (د ، ت) لە ئەنەس و ئیبنو عومەرەوە (طس) لە جابرەوە.

(١٠٢) كان إذا دخل الكنيف قال بسمِ اللهِ اللهمَّ إني أعوذُ بِكَ مِنَ الخبْثِ و الخبائِثِ.

(صحيح) (ش) عن أنس

## ماناى فەرموودەكە

(١٠٢) كاتێك كە چوە ئاودەستەوە فەرموی: بسم الله ئەی خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە(الخبث و الخبائث) جۆرێكن لە جنۆكە وە نێرو مێن.

(صەحیحە) (ش) لە ئەنەسەوە

(١٠٣) كانَ إذا خَرجَ مِنَ الغائِطِ قالَ: غفرانك.

(حسن) (حم ، ٤ ، حب ، ك) عن عائشة

## ماناى فەرموودەكە

(١٠٣) كاتێك لە ئاودەست هاتە دەرەوە دەیفەرموو: غفرانك

(حەسەنە) (حم ، ٤ ، حب ، ك) لە عائشەوە.

بەشی یەكەم كۆتایی هات و چاوەڕوانی بەشی دووەم بن كە دەست پێ دەكات بە(دەربارەی خۆشۆردن و هۆكارەكانی).

والحمد لله رب العالمين

# ناوەڕۆک

**بابەت** | **لاپەڕە**